# براکانی یوسف ( علیهم أفضل الصلاة والسلام )

# هەموویان پێغەمبەر بوون

وەرگێڕانی

طارق الکردی

٢٠٢١/١١/٢٢

## بسم الله الرحمن الرحيم

الله جـل جـلاله دەفـەرمـوێـت : (قُولُوا آمَنَّا بِاللَّهِ وَمَا أُنْزِلَ إِلَيْنَا وَمَا أُنْزِلَ إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالأَسْبَاطِ وَمَا أُوتِيَ مُوسَى وَعِيسَى وَمَا أُوتِيَ النَّبِيُّونَ مِنْ رَبِّهِمْ لا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ) [سورة البقرة :١٣٦]

ئـەی ئیمانداران بڵێن : ئیمانمان هێناوە بە : الله وەبەوەی بۆمان دابەزیوە ، وەبەوەی دابەزیوە بۆ ابراهیم و اسماعیل و اسحاق و یعقـوب و نەوەكانی یەعقوب ، وە بەوەی هاتوە بۆ موسی و عیسی و بەوەی هاتوە بۆ پێغەمبەران لەلایەن الله وە ، وە جیاوازی ناكەین لە نێوانیان و ئێمە مسوڵمانین.

الله سبحان و تعالی لـەم ئایەتە پیرۆزەدا بـەڕوونـی ئـەوە دەسەلمێنێت كە وەحـی بـۆ نەوەكانـی یەعقوب ناردوە ، وە ئـەو نەوانە مەبەست پێـی كوڕەكانـی یەعقوبە واتـە براكانـی یوسف ، وەک سەلەف بـەم شێوە باسیان كردوە و ڕونیان كردوەتەوە.

ئـەم نامیلكە بـەیان كردنـی سەر لێشێواندنەكانی موتەئەخیرینە لە ئینكاری كردنـی یازدە پێغەمبەر بەتەواوی كە بریتین لە براكانی یوسف علیه السلام ، كە الله منەتـی خۆی ڕشت بەسەریاندا بـە پێغەمبەرایەتی لـە دوای تەوبە و تاقـی كردنەوەیان ، تـەواوی سەلەف پێغەمبەرایتـی ئەوانیان جێگیر كردوە.

نین كەسانێک لەسەردەمی ئەواندا ئینكاری ئەمەیان كردبێت ، تا ئەودەمەی گـرێ كوێرەكانـی ئەشعەریەكـان پەیدابون دەربـارەی پێغەمبەرایەتـی و سەرلـێ شێواندنەكانی ئـەم كۆمەڵە تیاچوە لەسەر بنەمای عصمە ، كـە متـأخرین لـەسەر ئەو بنچینە دەڵێن ناكرێ پێغەمبەران هەڵەی ئاوا بكەن ، ئەم بنچینە فاسدەشیان

داوەتە پاڵ ئەهلـی سونە ئینكاری پێغەمبەرایەتـی براكانـی یوسف دەكەن ، بە گومان و بۆچونی هیچ.

وە ئاساری ڕوون و ئاشكرایان گۆڕیوە و لایان داوە لە جێگیر كردنـی ئەمەدا بە قسەگەلێک كە هاوشێوەی درۆیە. (وەک عادەتی خۆیان جەهمی و ئەشعەری و موعتەزیلە).

كەسانێكیش كـە كاریگەر بون بەوان ئەم باسەیان ڕەت داوەتەوە و ئینكاری پێغەمبەرایەتی ئەوان دەكەن لەوانە :

ابـن حـزم و قرطبـی و ابن تیمیة و ابـن كثیر و سیوطـی و زۆرینـەی موعاصرین.

بـە دەلیلـی ئەوەی هیچ بەڵگەیەک نیە لە هیچ صەحابە و تابعینێكەوە كـە بڵـێ براكانـی یوسف پێغەمبەر بـوون وەئەوەی ئەوان دەیڵێن بریتیـە لەوەی كـە پێیـان وایە أسباط بریتین لە نەوەكانی یەعقوب ، وە نەوەكانی یەعقوب مەبەست پێـی منداڵەكانـی پشتـی نیە كە براكانـی یوسفن ، بەڵكـو مەبەست نەتەوەكانە لە بەنی ئیسرائیل ، ئەمە ئەوەیە ئەوان دەیڵێن.

وە ابن تیمیە نامەیەكی نوسیوە بۆ ئینكاری كردنی پێغەمبەرایەتیان وە پڕی كردوە لـە گومان و بۆچونـی خـۆی ، پاشان تەناقضـی كردوە و هاتوە لـە كتابی منهاج السنة پێغەمبەرایەتیان جێگیرەكات وەک عادەتی هەمیشەیی كە جێگیر نیە لەسەر وتەیەک ، وە سیوطی نامەیەكی نوسیوە و ناوی ناوە دفع التعسف عن اخوة یوسـف ، پـڕی كردوە لـە تەحریف و لغو وە جەمعـی كردوە بەبێ تحقیق ، هەروەها ابن كثیریش ڕەدی ئەداتەوە وەهیچ یەكێـک لـە موعاصرین نیە كـە پێـی بوترێ زانا و پێغەمبەرایەتیان جێگیر كات و دیفاعیان لێبكەن.

بەڵكو زۆرینەیان كاتێ تەفسیری سورەتی یوسف دەكەن و دێنە سەر باسی براكانــی یوسف ، شتانێكیان پێدەڵێــن كــە هیچ شایستە نیــە بوتــرێ بەكەسێكی چاك ، چجای ئەوەی بوترێ بە پێغەمبەرێك وەك الحجی وتی دەربارەیان.

## ئەوانەی پێیان وایە پێغەمبەر بون ( صەحابە و تابعینن )

لە هاوەڵان : ابن مسعود و ابن عباس ــن.

وە لە تابعین و شوێن كەوتوانیان لەهەموو جێیەك : سعیدی كوڕی جبیر و حەسەنی بەصری و عطاء و أبــو عمران الجونی و ربیع بــن أنــس و قتادة و ابــن أسلم و ضحاك ســودی و ابو عالیە ، وە لــەدوای ئەوان : ابن جریج و سوید بن مسلم و ابــن اسحاق و موقاتل بــن سلیمان و ابن عیینە و أبو مصعب القاسم بن أبــی بكــر القرشــی فەقیهــی مەدینــە ، وە ئیمامــی أحمدیــش ئــامــاژەی بــۆ پێغەمبەرایەتیان كردوە .

لــە ئــەهلــی تــەفسیر و مــوفەسیریــن ئــەوانەی ئــاماژەیــان كــردوە بــە پێغەمبەرایەتیان زۆرن لەوانە :

طبری و زجاج و ابن ابی زمنین و ابن طاهری مقدیسی و بغوی و سمعانی و ثعلبی و مكی ابن أبی طالب و بیهقی و واحدی و قصاب و أصفهانی و جگە لەوانیش لە موفەسیرین و مێژو نوسان و موحەدیثین كە ئەم ئاسارانەیان گێڕاوەتەوە بەبێ ئینكاری كردن.

وە ئێــمە بەسمانە كــە سەلــەف گێڕاویــانــەتەوە و ڕەدیــان نــەداوەتەوە و تەسلیمی بون ئەمەش هەندێك لەو ئاسارانە :

حاکم ریوایەتـی کـردوە بـە سەنەدێکـی جید لە ابن مسعود کە فەرمووی : قەبیلەکان بریتین لە منداڵەکانی یەعقوب : یوسف و بنیامین و روبیل و یەهوذا و سەمعون و لاوی و دان و فەهات ، کـە ١٢ پیاو بوون ، الله ١٢ قەبیلەی لێ جودا کردنەوە ، کەس ڕەچەڵە کیان نازانێ جگە لە الله ، الله دەفەرموێت : (وَقَطَّعۡنَـٰهُمُ ٱثۡنَتَیۡ عَشۡرَةَ أَسۡبَاطًا أُمَما). المستدرک (٤٠٨٠)

حاکم دەڵێت : ئەم حەدیسە صەحیحە لەسەر مەرجی مسلم.

دەڵێین : ئەمە دەقێکی ڕوونە کـە تەفسیری أسباط کراوە بە براکانی یوسف ، تەنانەت یەک یەک ناویشـی بـردون پێچەوانەی ئەوانە کـە پێیان وایـە أسباط بریتیە لە ئومەت و نەوەکانی بەنو ئیسرائیل.

وە گومانی تێدانیە ئەم ئەسەرە حوکمی ڕەفعی هەیە ، چونکە ابن مەسعود تەنانـەت موتەئەخیرین و جەهمـی و ئەشعەریە کانیش پێیان وانیە ریوایەتەکانی ئیسرائیلیاتە و ئەوە نادەنە پاڵی ، کەوایە بەڵگەیە بەسەریانەوە قبحهم الله.

هەروەها حاکـم ریوایەتـی کردوە ٤٠٩١ وە ابـن أبـی حاتم ١١٩٥٧ ریوایەتی کردوە لـە ابن مسعودەوە بە سەنەدێکی صحیح کە فەرمویەتی : یوسف کڕدرا بە ١٠ درهەم ، وە کـەس و کاری کاتێـک ناردی بەدوایان لە مصر بوون ٣٩٠ کەس بـوون ، پیاوەکانیان پێغەمبـەر بـوون ئافرەتەکانیان لـە ڕاستگۆیان بـوون ، والله لەگەڵ موسی دەرنەچون تاوەکو گەشتنە ٦٠٠ هەزار .

حاکم دەڵێت ئەم حەدیسە صەحیحە ئیسنادەکەی.

طبری لە تەفسیرەکەی (١٢١/٢) دەیگێڕێتەوە لە ابـن جریج لـە ابـن عباس کـە فەرموویەتـی : الأسباط واتە : کوڕەکانـی یەعقوب کـە ١٢ پیاو بـوون .

دەڵێیـن : ئەمـە تەفسیـری ئـایەتـی نەوەکانـی پێغەمبەرانە ، سـەنەدەکەی صەحیحە ، متفق علیه .

ئـەوانـەی سەنەدەکان ناناسن پێیـان وایە ئەم سەنەدە منقطعە ، ابن جریج نەگەشتوە بـە ابن عباس ئەم متأخرە ، بەڵام تەفسیری ابـن جریج کاتێک حجاج لێوەی ریوایەتەکات وەک ئـەم ئـەسەرە ئەوا صحیحە لـە ابن عباس لای ئەهلـی حەدیث بۆ ئەو پەیوەندی بەهێزی متمانە پێکراو هەیە و جێگیرە وە ابن جریج گێڕاویەتیەوە بە واسیتەی موجاهید لە صەحیفەی قاسم بن أبی بزە وەک ئەوەی جگە لە یەکێک لە متقدمین باسیان کردوە ، هەر لەبەرئەوەیە خلیلی لە الإرشاد دەڵێت : حەجاجی کوڕی محمد ریوایەتی کردوە لە ابن جریجەوە صەحیحە ، متفق علیه.

ئـا لـەم ئەسەرەدا ابـن عباس زۆر بەڕوونـی دەریەخات کـە براکانـی یوسف بریتین لە نەوە باسکراوەکان لە ئایەتەکە کە پێشەوای قەبیلەکانیان بون ژمارەیان دوازدە کەس بوە.

# ئەوانەی باسی پێغەمبەرایەتی ئەوانی کردوە له زانایان

( سعيد بن جبير )

طبرى ريوايەتی كردوە لەتەفسيرەكەی ١٩٧٨٥.

( حسن البصري )

ابن أبى حاتم لەتەفسيرەكەی بەژمارە ١١٩٣٢ وە ابن أبى زمنين ريوايەتی كردوە ٣١٦/٢.

( عطاء و حسن البصري )

أبو نعيم له صفه النفاق ٥٦ وه طبرى له تەفسيرەكەی ١٦٩٩٩ وه اللالكائى ١٨٨٠ وە أبو على بن شاذان له جزئەكەی ٧٦ وه ابن عدى له الكامل ٧٣٢٥ گێڕاويانەتەوە لەوانەوە.

( السدي )

وە طبرى ريوايەتی كردوە بەژمارە ٢١٠٥ وە ابن أبى حاتم له تەفسيرەكەی بەژمارە ١٣٠١ وە ابن المنذر له تەفسيرەكەی ٦٦٩.

( قتادة )

طبرى ريوايەتی كردوە ٢١٠٤.

( الربيع بن خيثم )

طبري بەژمارە ٢١٠٦ ريوايەتی كردوە.

( الضحاک )

ابن المنذر بەژمارە ٦٧٠.

( أبو العالية )

ابن أبى حاتم ١٣٠٠ ريوايەتى كردوه لێوەى.

( ابن زيد )

الطبري في تفسيره ١٨٧٨٧ وه ابن أبي حاتم في تفسيره ١٢١٧٤.

( أبو عمران الجوني )

الطبري ١٩٩٤٩.

( ابن جريج )

وه ابن جوزي له زاد المسير ٤٦٧/٢.

( سفيان بن عيينة )

طبري ٢٤٧/١٦.

وه طبري له محمد بن إسحاق ٢١٠٧ گێڕاويەتيەوه.

هەروەها ئيمامى شافعى باسى كردووه وەک له سنن الكبرى ـى البيهقي هاتوه ٩٥/٧.

وه أحكام القرآن للشافعي رواية البيهقي ١٣٦/٢ باسيان كردوه.

( أبو عمر بن علاء )

سمعاني له ته فسيره كه ى ١٢/٣.

( أبو مصعب القاسم بن أبي بكر القرشي )

الطبري له ته فسيره كه ى ٢٤٢/١٦.

مقاتل بـن سليمان لـە تەفسیرەکەی ١٤١/١ دەڵێـت : ئەوەی دابەزێندرا بۆ پێغەمبەران لـە ابراهيم و اسماعيل و اسحاق و يعقوب و نەوەکانـی کە کوڕەکانی یەعقوبن ، یوسف و براکانی بۆ ئەوانە پەڕاوی ابراهیم دابەزی.

سمعانـی لەتەفسیرەکەی ١٢/٢ دەگێڕێتەوە لـە أبي عمر بن العلاء لوغەوی گەورە و مەشهور پرسیاری لێکراوە دەربارەی ئایەتی الله ( أَرْسِلْهُ مَعَنَا غَدًا يَرْتَعْ وَيَلْعَبْ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ) ووتی: چۆن وتیان یاری بکەین؟ لەکاتێکا ئەوان پێغەمبەر بوون ؟ ووتی : ئەمە پێش ئەوە بوو ببنە پێغەمبەر.

طبری لەتەفسیرەکەی دەیگێڕێتەوە ٢٤٢/١٦ لە أبو مصعب قاسم بن ابی بکر القرشی القاضی لەتەفسیری ئایەتی ( فَأَوْفِ لَنا الكَيْلَ وتَصَدَّقْ عَلَيْنا إنَّ اللّهَ يَجْزِى المُتَصَدِّقِينَ ) کەدەڵێت : ئەوەیان بۆیە وت چونکە صەدەقە بۆ ئەوان حەڵاڵ بوو ، ئەوان پێغەمبەر بوون ، صەدەقە بۆ محمد حەرام بوو.

ابـن أبـی زمنين لـە تەفسیرەکەی دەڵێت ٣٣٨/٢ : اذ أنتم جاهلون واتە : ئەوەی لـە ئێوە ڕویـدا بـە نەزانین بـوو ، کاتێک یوسفیان وەها لێکرد و لەسەحرا فڕێیان دا ، هێشتا نەبوبون بە پێغەمبەر ، واتە پێش پێغەمبەرایەتیان بوو ، واتە دواتر بون بە پێغەمبەر.

لە البداية والنهاية لإبن كثير هاتوە ٤٦٦/١ : دەربارەی ئایەتی الله (قولوا آمنا بالله وما أنزل إلينا) بۆ (عما كانوا يعملون) واتە : بڵێن ئەی ئیمانداران بەو یەهود و نەصارایانە کاتێک بە ئێوەیان دەوت ببنە یەهود و نصاری هیدایەت دراوە بن : ئیمانمان هێنا بە الله واتە بەڕاستمان زانی وە ئەوەش بۆمان دابەزی بەڕاستمان زانی کە قورئانە وەبەوەی دابەزی بۆ ابراهيم و اسماعيل و اسحاق و یەعقوب و

نەوەکانــی کــە ١٢ کوڕی یەعقوب بوون کــە هەموویان پێغەمبەر بوون ، منداڵــی هەریەکێک لەوانە ئومەتێک بوون لە خەڵکی ناونران بە أسباط.

لە نکت القرآن هاتوە ٦٠٩/١ : أبــو أحمدی قصاب دەڵێــت : دەربارەی وتەی الله بۆ براکانی یوسف (إِذْ قَالُوا لَيُوسُفُ وَأَخُوهُ أَحَبُّ إِلَى أَبِينَا مِنَّا وَنَحْنُ عُصْبَةٌ إِنَّ أَبَانَا لَفِي ضَلالٍ مُبِينٍ) لــەگــەڵ هــەموو ئــەوەی باســی کرد لــەو غەدرەی کــردیان بــە براکەیان کــە خستیانە سەحراکە بیرەکە ، وە درۆکردنیان دوای گەڕانەوەیان بــۆ لای باوکیان ، ڕەدە بــۆ خەواریج کە پێیان وایە تاوان کوفرە ، نەیان توانی ئەوان کــافر کــەن چونکە پێغەمبەر بوون.

بیهقی لە سنن الکبری ٩٥/٧ وە احکام القران لشافعی ریواية بیهقی ١٣٦/٢ دەربارەی بەسەرهاتــی براکانــی یوسف دەڵێت علیهم السلام : وما شهدنا الا بما علمنا وما کنا للغیب حافظین.

لێــرە سڵاواتیان لەسەر دەدا ئەمەش دەریەخا بە پێغەمبەری زانیون.

ربیع بــن انس بــۆ تەفسیری أسباط دەڵێت : بریتین لــە یوسف و براکانی ١٢ پیاو بوون.

طبری ٢١٠٤

طبری لــە تەفسیرەکەی دەربارەی ئایەتــی فتصدق علینا دەڵێــت : لێــرە ئیشکال دروستبوە لای سەلەف : ئایا صدقە جائیزە بۆ پێغەمبەران؟ چۆن براکانی یوسف داوای صدقە دەکەن؟

پــاشان وەڵامــی سعید بــن جبیــر نقڵەکــات دەربــارەی ئــەم ئیشکالە لــە تەفسیرەکەی بە ژمارە ١٩٧٨٥ : کە دەڵێت : هیچ پێغەمبەرێک داوای صەدەقە و خێــری نــەکردووە هەرگیــز بــەڵکو ووتیــان : جئنــا ببضاعة مزجاه..) سیعرمــان

لێ کەم مەکەوە، ئەوانیش پێغەمبەر بون بۆیە داوای خێریان نەکردوە.

ابن أبی حاتم ریوایەتی کردوە **١١٩٣٢** لە حەسەنەوە دەربارەی ئایەتی (فأوف لنا الكيل وتصدق علينا) ، ووتـی بەکەمـی پارەکەمان پێمان ببەخشە، سعـیدی کوڕی جوبەیر وتی : پێغەمبەران خێر ناخۆن.

بڕوانە چۆن پێغەمبەرایەتیان دەسەلمێنن.

ئەوەی ماوە بەشە خراپەکەیە جائیز نیە بۆیان ، وتی جائیزە بۆ ئێمە.

حەسەنـی بەصـری دەربـارەی ئایەتـی **(ويتم نعمته عليك وعلى آل يعقوب)** دەڵێـت وەک لای ابـن ابـی زمنین هاتـوە ٣١٦/٢ : الله بەئاگای کردبـوو کـە پێغەمبەرایەتی دەدا بە کوڕەکانی یعقوب.

بغـوی لـە تەفسیری ئایەتـی پێشوو دەڵێـت : کـوڕەکانـی یعقوب هەمویان پێغەمبەربوون.

ابن عباس لـە تەفسیری اسباط کە الله بـە پێغەمبەر باسـی کردون دەڵێت واحدی لە وسیط هێناویەتی ٢١٧/١ : بریتین لە کوڕەکانی یەعقوب کە ١٢ کەس بوون.

# تەفسيری أسباط

سەلەف أسباطيان بە براكانی يوسف تەفسير كردوە ، پێچەوانەی ئەوانەی كەدەڵێن نەخێر واتای ئومەت دەدا نەک مناڵەكانی يعقوب.

خرائطی لە مكارم الأخلاق دەڵێت ٣٧١ : لە وەليدی كوڕی موسليمەوە كە دەڵێت : يوسف وتی بە براكانی الأسباط.

طبری لە تەفسيرەكەی دەڵێت : الأسباط ١٢ پياو بوون لە كوڕەكانی يەعقوب.

بغوی لە تەفسيرەكەی دەڵێت ١٧٢/١ : الأسباط واتە منداڵەكانی يعقوب.

مكی بن أبی طالب لە الهداية ٤٥٩/١دەڵێت : يعقوب كوڕەكانی كۆكردەوە كە ١٢ كەس بوون كە بريتيبون لە الأسباط كۆی كردنەوە و وەسێتی بۆكردن.

كەوابوو كاتێک الله دەفەرموێت : يعقوب نەوەكانی كۆكردوە واتای ئەوەنيە هەموو بەنی ئيسرائيلی لەيەک مەجليس كۆكردبێتەوە بەڵكو تەنها توانيويەتی كوڕەكانی كۆبكاتەوە.

لێرە فەرمووی أسباط ١٢ پياو بوون واتە بريتين لە كوڕەكانی.

بغوی لە تەفسيرەكەی دەڵێت ٤٨٦/٢ : كوڕەكانی يعقوب هەمويان پێغەمبەربوون.

قرطبی لە أحكام القران نقڵی دەكات و دەڵێت ٢٩/٩ : زۆرێک لە موفەسيرين دەڵێن كوڕەكانی يعقوب پێغەمبەر بوون.

كەچی خۆی ئينكاری دەكات قورطبی!!!

عطاء بن أبی رباح دەڵێت : ئەوەی براكانی یوسف كردیان لەگەڵ باوكیان یعقوب واتای وانیە مونافیق بن بەڵكو ئەوان پێغەمبەرن. احكام القران ٢١٤/٨.

لـە هەندێك ئایەت وشـەی أسباط هاتوە مەبەست پێـی ئومەتانە بەڵام لێرە مەبەست پێی كوڕەكانی یعقوبە كە ڕونمان كردەوە.

## ناوی براكـانی یوسـف

مقاتل بـن سلیمان لـە تەفسیرەكەی وە ٣٢٠/٢ وە ابـن حبیب لـە المحبر ٣٨٦/١ دەڵێن : براكانـی یوسـف ئەمانـەن ( روبیل ، یهوذا ، شمعون ، لاوی ، نقتولن ، ربولن ، آشر ، استاخر ، جاب ، دان ، یوسف ، بنیامین).

واجبە ئیمانت بە پێغەمبەرایەتیان هەبێت.

بـرا و خوشكی شوێن كەوتەی ئەثەر ، كاتێك زانیت و بۆت ڕون بویەوە كە كوڕەكانـی یعقوب هەموویان پێغەمبەرن وەك سەلەف فەرمویان واجبە لەسەرت بڕوات بە پێغەمبەرایەتیان هەبێت وەك هەموو پێغەمبەرانی تر.

الله دەفەرموێـت دوا بـەدوای باسكردنـی براكانـی یوسف كـە پێغەمبەرن و وەحیان بۆ كراوە.

فإن امنوا ...... ، گـەر ئیمانیان هێنا بـەو شێوەی ئێـوە ئیمانتان هێناوە ئەوكات هیدایەت دراون.

طبری لە تەفسیرەكەی دەڵێت : گەر یهود و نصاری بەڕاستیان زانی ئەوەی بۆ ئێوە و ابراهیم و اسماعیل و اسحاق و یعقوب و كوڕەكانی هاتوە و دانیان پێدانا وەك ئەوەی ئێوە بەڕاستان زانیوە ئەوكاتە هیدایەت دراو و ڕێ نیشاندراون.

هەروەها طبری لەتەفسیری ئایەتی ( قُلْ آمَنَّا بِاللَّهِ وَمَا أُنْزِلَ عَلَيْنَا وَمَا أُنْزِلَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالأَسْبَاطِ وَمَا أُوتِيَ مُوسَى وَعِيسَى وَالنَّبِيُّونَ مِنْ رَبِّهِمْ لا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ).

دەڵێت : بڵێ ئەی محمد ئیمانمان هێناوە و بەڕاستمان زانیوە ئەوەی بۆ ئێمە دابەزیوە وە بەوەی بۆ ابراهیم و اسحاق و یعقوبیش هاتوە ، وە ئیمانمان بەوەش هەیە بۆ کوڕەکانی یعقوب هاتوە کە ١٢ پیاو بوون ، لانفرق بین احد منهم ، واتە هەندێکیان بەدرۆ ناخەین و بڕوامان بەهەندێکی تریان هەبێت.

والحمدلله.

وەرگێڕانی :طارق الكردي

٢٠٢١/١١/٢٢ دوای عیشا